

# هەڵوەشێنەرەکانی ئیسلام

**نووسینی**

زانای پایەبەرز

## عبد العزیز بن عبد اللّٰہ بن باز

موفتیی گشتی و سەرۆکی دەستەی گەورەزانایانی ئەودەمی عەرەبستانی سعودی

(ڕەحمەتی خودای لێبێت)

**وەرگێڕانی**

خدرنەژاد کوردستانی

(خودا لێی خۆش بێت)



مافی بڵاوکردنەوەی بۆ هەموو موسوڵمانێکە

ساڵی ١٤٣٠ ی کۆچی

# پێشەکی

الحمد لله، والصلاة والسلام على من لا نبي بعده، وعلى آله وأصحابه ومن اهتدى بهداه.

بزانە ئەی موسوڵمان کە خودای گەورە واجبی کردووە لەسەر هەموو بەندەکان بچنە نێو ئایینی ئیسلام و دەستی پێوە بگرن و، خۆ بپارێزن لە هەرچیش کە پێچەوانەی ڕێنماییەکانی ئیسلام بێت، پێغەمبەرەکەشی "موحەممەد (ﷺ)" ی ناردووە بۆ بانگەواز بۆ ئەم ئایینە و، ڕایگەیاندووە کە هەرکێ شوێنی بکەوێت؛ ئەوە ڕێبواری ڕاستەڕێیە و، ئەوەش کە پشتی تێبکات؛ ئەوە گومڕایە، لە زۆرێک ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزیشدا لە هۆکارەکانی هەڵگەڕانەوە و هەموو جۆرەکانی شیرک وکوفر ئاگاداریی داوە، زانایانی ئیسلامیش (ڕەحمەتی خودایان لێ بێت) لە بابی حوکمی هەڵگەڕاوە "حكم المرتد" دا ئەوەیان باس کردووە کە ئەو شتانەی کە موسوڵمانی پێ هەڵگەڕاوە دەبێت و خوێن و ماڵی حەڵاڵ دەکات و، پێی دەردەچێت لە دین؛ جۆرەکانی زۆرن، جا ترسناکترین و باوترینی ئەوانەش؛ بریتییە لە دە هەڵوەشێنەرەکەی ئیسلام(*)، ئێمەش لێرەدا بە پوختی دەیخەینە ڕوو بۆ ئەوەی خۆتیانی لێ دوور بگریت و خەڵکی دیکەشی لێ ئاگادار بکەیتەوە، بە ئومێدی ئەوەی کە لێیان بێوەی و خاوێن بین، لەگەڵ کەمێک ڕوونکردنەوەش لە کۆتاییدا.

---

(*) کە پێشەوا موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب و زاناگەلی دیکەش باسیان کردووە (ڕەحمەتی خودا لە هەموویان بێت).

## دە هەڵوەشێنەرەکەی ئیسلام

**یەکەم:** هاوەڵ دانان بۆ خودا لە پەرستشیدا "الشرك في عبادة الله تعالى"، خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ﴾ [النساء: ٤٨]، واتە: "خودا لەوە خۆش نابێت هاوەڵی بۆ دابنرێت و جگە لەوە خۆش بێت بۆ هەرکەسێ خۆی بیەوێت"، هەروەها فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُۥ مَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ٱلۡجَنَّةَ وَمَأۡوَىٰهُ ٱلنَّارُۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٖ﴾ [المائدة: ٧٢]، واتە: "بە ڕاستی ئەوەی هاوەڵ بۆ خوا دابنێت؛ ئەوە خودا بەهەشتی لێ قەدەغە کردووە و جێگەی ئەو ئاگرە و بۆ ستەمکاران هیچ پشتیوانێک نییە"، جا لە جۆرەکانی هاوەڵ بۆ خوا دانان ـ شیرک ـ : هاوار کردنە مردووان و، کۆمەک لێ خواستنیان و، نەزر و قوربانی کردن بۆیان.

**دووەم:** ئەوەی لە نێوان خۆی و خودای گەورەدا واسیتە و نێوبەند دابنێت، بۆ ئەوەی هاواریان تێ بکات و، تکا و شەفاعەتیان لێ بخوازێت و، پشتیان پێ ببەستێت؛ ئەوە کافر دەبێت، بە ئیجماع ـ واتە ناکۆکی نییە لە کافربوونیدا ـ.

**سێیەم:** ئەوەی هاوەڵدانەران ـ موشریکان ـ بە کافر نەزانێت یان گومانی هەبێت لە کافرێتییاندا یان ڕێڕەویان بە ڕاست بزانێت؛ ئەوە کافر دەبێت.

**چوارەم:** ئەوەی بڕوای وا بێت کە ڕێبازێکی دیکە لە ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ) تەواوترە، یان حوکمی یەکێکی دیکە لە هی ئەو باشترە، وەک ئەوانەی کە حوکمی تاغووتان بە چاکتر دەزانن لە حوکمی ئەو؛ ئەوە کافر دەبێت.

**پێنجەم:** هەر کەسێک ڕقی لە هەر شتێک بێت کە پێغەمبەر (ﷺ)

هێنابێتی، ئەگەرچی کاریشی پێ بکات؛ ئەوە کافر دەبێت، خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ ﴾[محمد: ٩]، واتە: "ئەوە لەبەر ئەوەی ئەوان ڕقیان لەوەیە کە خودا ناردوویەتیە خوارێ؛ خودا کردەوەکانیانی پووچکردنەوە".

**شەشەم:** ئەوەی گاڵتە بکات بە شتێک لە دینی پێغەمبەر (ﷺ) ، یان پاداشتی یان سزای؛ ئەوە کافر دەبێت، بەڵگەش ووتەی خودای گەورەیە کە فەرموویەتی:﴿ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ﴾[التوبة:٦٥-٦٦]، واتە: "بڵێ ئاخۆ گاڵتەتان بە خودا و ئایەتەکانی و پێغەمبەرەکەی دەکرد؟ * بیانوو مەهێننەوە، ئێوە پاش ئیمان هێنانتان؛ کافر بوونەوە".

**حەوتەم:** جادوو ـ سحر ـ ، لە ڕێزەی جادووش: (الصرف) دڵباری و (العطف) دڵداری(*)، ئەوەی ئەنجامی بدات یان پێ ڕازی بێت؛ ئەوە کافر دەبێت، بەڵگەش ووتەی خودای گەورەیە کە فەرموویەتی:﴿ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَا إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ﴾[البقرة: ١٠٢]، واتە: "کەسیان فێری جادوو نەدەکرد تا پێیان دەگوت: ئێمە تەنها بۆ تاقی کردنەوەین، تۆ خۆت کافر مەکە".

**هەشتەم:** پشتیوانی کردنی کافران و یارمەتیدانیان لە دژی موسوڵمانان، بە بەڵگەی وتەی خودای گەورە کە فەرموویەتی:﴿ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴾[المائدة:٥١]،

---

(*) (الصرف) جادوویەکی شەیتانییە، دەکرێت بۆ تێکدانی نێوان ژن و مێرد، وە (العطف) بۆ ڕاکێشانی ئەوینی پیاوێک بۆ ژنێک یان ژنێک بۆ پیاوێک کە یەکتریان بەدڵ نەبێت.

واتە: "هەرکەسێکیش لە ئێوە دۆستایەتییان بکات ـ واتە هی جوولەکە و گاوران و بێباوەڕانیش بەگشتی ـ ئەوە ئەویش لە ئەوانە، بێ شک خودا ڕێنمایی ستەمکاران ناکات".

**نۆیەم:** هەرکەسێک باوەڕی وابێت کە هەندێک کەس بۆی هەیە لە شەریعەتی موحەممەد (ﷺ) بچێتە دەرێ؛ ئەوە کافر دەبێت، لەبەر وتەی خودای گەورە: ﴿ وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴾[آل عمران:٨٥]، واتە: "وە هەرکەسێک بەدەر لە ئیسلام هەر دینێکی دیکە هەڵبژێرێت؛ ئەوە لێی قبووڵ ناکرێت و لە دواڕۆژدا لە ڕێزەی دۆڕاوەکانە".

**دەیەم:** پشتگوێ خستنی دینی خودا بەوەی کە نەخۆی لێ فێر بکات و نە کاریشی پێ بکات، بە بەڵگەی وتەی خودای گەورە: ﴿ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ثُمَّ أَعۡرَضَ عَنۡهَآۚ إِنَّا مِنَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ مُنتَقِمُونَ ﴾ [السجدة:٢٢]، واتە: "وە کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە ئایەتەکانی خودای وە بیر بهێنرێتەوە پشتگوێی دەخات، بێ گومان ئێمە تۆڵە لەو تاوانکارانە دەکەینەوە".

لە هەموو ئەم هەڵوەشێنەرانەدا هیچ جیاوازی نیە لە نێوان شۆخیکەر و دڵمەند و ترساو (الهازل والجاد والخائف) دا، جگە لە کەسێکی کە بە زۆر ناچار کرابێت "المکره"، وە هەر هەموویان یەک لە یەک ترسناکترن و، زۆریش بڵاون، هەربۆیە پێویستە موسوڵمان خۆی بپارێزێت لێیان و، وریا بێت لەوەی تووشیان ببێت.

بەشی چوارەم ئەوەش دەگرێتەوە: هەر کەسێک بڕوای وابێت کە ئەو سیستەم و یاسایانەی خەڵکی دایدەنێن باشترە لە شەریعەتی ئیسلام، یان کە سیستەمی ئیسلام ناسازە بۆ جێبەجێ کردنی لە سەدەی بیستەمدا، یان کە ئیسلام بووە بە هۆی دواکەوتنی موسوڵمانان، یان کە ئیسلام قەتیسە لە پێوەندیی نێوان بەندە و پەروەردگاریدا، بەبێ ئەوەی خۆی بگلێنێتە کاروبارەکانی دیکەی ژیان، هەر ئەو بەشی چوارەمە ئەوەش دەگرێتەوە: ئەگەر بێت و کەسێک وا بزانێت جێبەجێ کردنی حوکمی خودا لە بڕینی دەستی دز و سەنگەساری زیناکەری ژندار؛ لەگەڵ سەردەمی نوێدا ناگونجێت، هەروەها ئەوەش دەگرێتەوە: هەرکەسێک بڕوای وابێت کە ڕەوایە حوکم بە جگە لە شەریعەتی خودا بکرێت لە مامەڵەکان و سنوورەکان و شتی دیکەشدا، هەرچەند باوەڕیشی وانەبێت کە ئەوە لە شەریعەتی ئیسلام چاکترە، چونکە ئەوە هەر بەمە؛ شتێکی بە ڕەوا زانیوە کە خودا حەرامی کردووە بە ئیجماع، هەر کەسێکیش حەرامێکی خودا کە لە دیندا ئێگجار زانراوە بەحەڵاڵ بزانێت، وەک: زینا و شەراو و ڕیبا وحوکم کردن بە غەیری شەریعەتی خودا؛ ئەوە کافر دەبێت بەبێ ناکۆکی بەڵکوو بە یەکدەنگی ـ ئیجماع ـ ی موسوڵمانان.

پەنا دەگرین بە خودا لە هەرچییەک کە دەبێتە مایەی خەشم و سزای سەختی.

وصلى الله وسلم على نبينا محمد وآله وصحبه

بۆ پێوەندی کردن بە وەرگێڕەوە؛ ئەم ئیمەیڵە بەکار بهێنە:
xdrnejad@gmail.com